بەشێک لە کتێبی :

# القَدَر

لأبي بكر جعفر بن محمد بن الحسن بن المستفاض الفريابي (٣٠١ هـ)



◦ عبدالملک الأثري ◦

١٤٤٥ هـ

بەشێک لە کتێبی :

# القَدَر

لأبي بكر جعفر بن محمد بن الحسن بن المستفاض الفريابي (٣٠١ هـ)





◦ عبدالملک الأثري ◦

١٤٤٥ هـ

١ - إبن عباس رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : کاتێک الله تعالی ئادەمی دروست کرد و ڕۆحی بەبەردا کرد - ئادەم - پژمی، پاشان وتی : الحمدلله، جا پەروەردگاری پێی فەرموو : الله ڕەحمت پێ بکات .

٢ - أبي هريرة رضي الله عنه ئەفەرمووێت : پرسیار کرا لە رسول الله ﷺ : کەی پێغەمبەرێتیت بۆ واجب بوو ؟ فەرمووی : (لەنێوان دروستکردنی ئادەم و ڕۆح بەبەردا کردنی ) .

---

١٩٩ - حرب بن إسماعیل الکرماني وتی : وتم بە إسحاق بن راهویە فەرموودەی میسرة الفجر رضي الله عنە کە دەڵێت : وتم ئەی رسول الله کەی بوویت بە پێغەمبەر ؟ فەرمووی : (ئادەم لە نێوان ڕۆح و جەستەدا بوو ) مانای چییە ؟

إسحاق وتی : (پێش ئەوەی ڕۆحی بەبەردا بکرێت، وە دروست کرابوو ) [السنة الخلال] .

٣ - سلیمان التیمي وتی : پرسیار کرا لە عمر بن عبدالعزیز لەبارەی قەدەر، عمر وتی : مێش نەفڕیوە لە نێوان ئاسمان و زەویدا ئیللا بە قەدەر نەبێت، پاشان بە پیاوەکەی وت : ئیتر پرسیار دەربارەی قەدەر نەکەیتەوە .

---

: ئەگەر جوڵانەوەی مێشێک بە قەدەری الله تعالی بێت، ئەولاتر نییە کار و کردەوەی تۆ بە قەدەری الله تعالی بێت ؟ ئەوەندەی مێش یێک گرنگیت پێنەدراوە ؟

٤ - إبن عباس رضي الله عنهما ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ : کاتێک پەروەردگاری تۆ لە پشتی نەوەی ئادەم هەموو نەوەکانی دەرکرد﴾ (الأعراف : ١٧٢) .

فەرمووی : الله عز وجل ئادەمی دروست کرد، وە پەیمانی ئەوەی لێ وەرگرت کە پەروەردگاریەتی، جا ڕزق و ئەجەل و ئەوانەی بەسەری دێت نووسی، پاشان نەوەکانی دەرکرد لە پشتی لە شێوەی زەڕە - گەردیلە، یان شتێکی زۆر بچووک - دا، جا پەیمانی لێ وەرگرتن، وە ڕزق و ئەجەل و ئەوەی بەسەریان دێت نووسی .

٥ - عبادة بن الولید بن عبادة الصامت لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە چووەتە لای عبادة - باوکی - و لە نەخۆشی سەرەمەرگدا بوو، وتی : باوکە گیان، ئامۆژگاریم بکە .

وتی : دانیشە، تامی ئیمان ناکەیت و ناگەیت بە حەقیقەتەکەی هەتا باوەڕت بە قەدەر نەبێت بە خێر و شەڕیەوە .

وتم : جا چۆن بزانم خێر و شەڕی کامەیە ؟

وتی : بزانە ئەوەی کە توشت نەبووە نەئەبوو توشت ببێت، وە ئەوەی توشت بووە نەئەبوو توشت نەبێت، ئەگەر لەسەر جگە لەوە بمریت ئەوە ئەچیتە ناو ئاگر .

٦ - **عمير بن نفير** ئەفەرمووێت : (عەرشی الله عز وجل لەسەر ئاو بوو، جا قەڵەم ی دروست کرد، ئەوەی نووسی کە دروستی ئەکات، وە ئەوەی نووسی کە ڕووئەدات لە دروستکراوەکانیدا) .

٧ - **عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما باسی کۆمەڵێکی لەلا کرا کە قسە لە قەدەردا ئەکەن .

فەرمووی : (الله عز وجل بەرزبووەتەوە لەسەر عەرشەکەی پێش ئەوەی هیچ شتێک دروست بکات - واتە پێش ئەوەی ئەو شتانە دروست بکات کە پەیوەندی بە دروستکراوەکانیەوە هەیە، والله أعلم - جا یەکەم شت قەڵەم ی دروست کرد و فەرمانی پێ کرد ئەوەی بنووسێت کە ڕووئەدات هەتا ڕۆژی قیامەت) .

٨ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (الله عز وجل قەدەری دروستکراوەکانی نووسی وە عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو پێش دروست کردنی ئاسمانەکانی و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ) .

٩ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (کاتێک الله عز وجل بڕیاری دا لەسەر دروستکراوەکانی لە کتێبێکدا کە لەلای خۆیەتی لەسەر عەرش نووسی ڕەحمەتم پێش تووڕەبوونم کەوتووە) .

١٠ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (دروستکردنی هەر یەکێکتان ئەوەیە لە ڕەحمی دایکیدا چل ڕۆژ ئەمێنێتەوە، پاشان ئەبێت بە خوێنێکی مەییوی لەم جۆرە، پاشان ئەبێت بە پارچە گۆشتێکی لەم جۆرە، پاشان فریشتەیەک ئەنێردرێت بۆلای و فەرمانی پێ ئەکرێت بە چوار شت، ئەڵێت :

رزق و کار و کردەوە و ئەجەلی بنووسە، وە بنووسە بەدبەختە یان بەختەوەر - واتە جەهەننەمیە یان بەهەشتی - ، پاشان ڕۆح ئەکرێتە بەری، هەتانە کار و کردەوەی ئەهلی بەهەشت ئەکات، هەتا وای لێدێت نێوان ئەو و بەهەشت - دووریەکەی - لە قۆڵێک کەمترە، بەڵام الكتاب پێشی ئەکەوێت و بە کار و کردەوەی ئەهلی ئاگر کۆتایی بە کار و کردەوەی ئەهێنێت و ئەچێتە ناوی، وە هەتانە کار و کردەوەی ئەهلی ئاگر ئەکات، هەتا وای لێدێت نێوان ئەو و ئاگر - دووریەکەی - لە قۆڵێک کەمترە، بەڵام الكتاب پێشی ئەکەوێت و بە کار و کردەوەی ئەهلی بەهەشت کۆتایی بە کار و کردەوەی ئەهێنێت و ئەچێتە ناوی).

١١ - **عمران بن حصين** رضي الله عنه ئەفەرمووێت: (... ئەگەر هێندەی کێوی ئوحود ئاڵتونت هەبێت و بیبەخشیت، ئەوە لێت وەرناگیرێت هەتا باوەڕت بە قەدەر نەبێت بە خێر و شەڕیەوە ...).

١٢ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت: (الله عز وجل کۆتایی بە پێنج شتی هەموو بەندەیەک هێناوە: کار و کردەوەکەی، وە ئەجەلەکەی، وە ڕزقەکەی، وە شوێنەواری لەسەر زەوی، وە شوێنی مانەوەی).

١٣ - إبن عباس رضي الله عنهما سواری پاشی ئەو وڵاخە بوو کە رسول الله ﷺ سواری لەسواری بوو، **رسول الله** ﷺ پێی فەرموو: (ئەی کوڕی لاو من چەند ڕستەیەکت فێر ئەکەم، - سنوورەکانی - الله بپارێزە ئەویش ئەتپارێزێت، - سنوورەکانی - الله بپارێزە یارمەتیت ئەدات، وە ئەگەر داوات کرد داوا لە الله بکە، وە ئەگەر داوای یارمەتیت کرد داوای یارمەتی لە الله عز وجل بکە، وە بزانە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆ سوودپێگەیاندنت، سوودت پێناگەیەنن بە

شتێک ئیللا ئەوە نەبێت الله بۆی نووسیویت، وە ئەگەر کۆببنەوە بۆ زیانپێگەیاندنت، زیانت پێ ناگەیەنن ئیللا بە شتێک نەبێت الله بۆی نووسیویت).

١٤ - **أبي هريرة** رضي الله عنه ئەفەرمووێت پرسیار لە رسول الله ﷺ کرا دەربارەی منداڵی موشریکەکان؟ فەرمووی: (الله زاناترە بەوەی کە چییان ئەنجام ئەدا).

---

: منداڵی موسوڵمانان خیلافی تێدا نییە کە بەهەشتین، بەڵام منداڵی کافر کە ئەمرێت رسول الله ﷺ بەو شێوەیەی سەرەوە وەڵامی داوەتەوە.

١٥ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت: (هیچ یەکێک لە ئێوە تامی ئیمان ناکات هەتا باوەڕی بە قەدەر هەمووی نەبێت، وە باوەڕی بەوە نەبێت کە ئەمرێت و لە دوای مردن زیندوو ئەکرێتەوە).

١٦ - أبي الحجاج الأزدي ئەڵێت پرسیارم کرد لە **سلیمان** دەربارەی وتەی: (هەتا باوەڕت بە قەدەر هەمووی نەبێت)؟

وتی: (هەتا باوەڕ نەهێنێت بە قەدەر، بزانیت ئەوەی کە تووشت نەبووە نەئەکرا تووشت ببێت، وە ئەوەی تووشت بووە نەئەکرا تووشت نەبێت، وە نەڵێت ئەگەر ئاوا و ئاوام بکردایە ئەوە و ئەوە ئەبوو، وە ئەگەر ئاوا و ئاوام نەکردایە ئەوە و ئەوە نەئەبوو).

١٧ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (حەقیقەتی ئیمان تەواو و کامڵ نابێت هەتا نەزانێت ئەوەی کە تووشی بووە نەئەبوو تووشی نەبێت، وە ئەوەی تووشی نەبووە نەئەبوو تووشی ببێت ) .

١٨ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (بەندە ئیمانی نەهێناوە هەتا ئیمان نەهێنێت بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە ) .

١٩ - إبن عباس رضي الله عنهما ئەڵێت : (قەدەر ڕێکخەری تەوحید ە، هەر کەسێک بە تەنها الله عز وجل ی پەرست و ئیمانی بە قەدەر هێنا ئەوە دەستی گرتووە بەو پەتەی کە پچڕانی بۆ نییە، وە هەر کەسێک بە تەنها الله تعالی ی پەرست و قەدەری بە درۆ خستەوە ئەوە تەوحید ەکەی هەڵوەشاندووەتەوە) .

٢٠ - إبن عباس رضي الله عنهما ئەڵێت : (هەموو شتێک بە قەدەرە، تەنانەت دانانی دەستت لەسەر ڕوومەتت ) .

٢١ - زيد بن أسلم ئەڵێت : (قەدەر هێز - قودرەت - ی الله عز وجل ە، هەر کەسێک قەدەر بە درۆ بخاتەوە هێز ی الله عز وجل ی ڕەتکردووەتەوە) .

٢٢ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت ( . . . الله عز وجل دروستکراوەکانی دروست کرد، وە کار و کردەوە و ئەجەل و ڕزقیانی نووسی ) .

**٢٣** - **إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرموویت : (هیچ کەسێک زیادەڕەوی لە قەدەر دا نەکردووە ئیللا لە ئیمان دەرچووە) .

---

: (زیادەڕەوی لە قەدەر) واتە ڕۆچوون تێیدا و پرسیارکردنی زۆر دەربارەی .

**٢٤** - **مالک بن أنس** وتی : (نوێژ لە پشتی قەدەریەکانەوە ناکرێت) .

**٢٥** - **موسى بن أبي كثير** ئەڵێت : (قەدەر أبوجاد ی زەندیقیەتە) .

---

: (أبوجاد) واتە ئەلف و بێ، واتە قسە کردن لە قەدەردا بەو شێوەیەی قەدەریەکان قسەی تێدا ئەکەن کلیلی زەندیق بوونە .

**٢٦** - **عكرمة بن عمار** ئەڵێت : (گوێم لە قاسم و سالم بوو لەعنەتیان لە قەدەریەکان ئەکرد) .

**٢٧** - **مجاهد بن جبر** وتی : (قەدەریەکان مەجوس و یەهودی ئەم ئوممەتەن، ئەگەر نەخۆشکەوتن سەردانیان مەکەن، ئەگەر مردن نوێژیان لەسەر مەکەن) .

٢٨ - سيار و أبي هاشم الرماني ئەڵێن : (بەدرۆخستنەوەی قەدەر شیرک ە).

٢٩ - محمد بن كعب القرظي ئەڵێت : (مشتومڕ لەگەڵ قەدەریەکاندا مەکەن و لەگەڵیان دامەنیشن . . . سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئیبلیس لەعنەتی الله ی لێبێت زاناترە بە الله لە ئەوان، ئیبلیس لەعنەتی الله ی لێبێت ئەزانێت کێ گومڕای کردووە، بەڵام ئەمانە وا گومان ئەبەن خۆیان خۆیان گومڕا ئەکەن و هیدایەتی خۆیان ئەدەن).

٣٠ - أبا حازم ئەڵێت : (لەعنەتی الله لە دینێک بێت کە من گەورەترم لێی، واتە القدرية).

٣١ - إبن عباس رضي الله عنهما ئەفەرموویێت : (هیچ قەومێک لەسەر ڕووی زەوی لەوانەی کە دێن بۆلام و مشتومڕ ئەکەن بوغزێنراوتر نین لە قەدەریەکان، ئەوەش لەبەر ئەوەی کە زانا نین بە قودرەتی الله، الله پرسیاری لێ ناکرێت دەربارەی ئەو شتانەی ئەنجامی ئەدات، بەڵکو ئەوان پرسیاریان لێ ئەکرێت).

٣٢ - أبي الزبير لەگەڵ طاوس دا تەوافی کەعبەیان ئەکرد، بەلای معبد الجهني دا تێپەڕین، کەسێک بە طاوس ی وت : ئەوە معبد الجهني یە، - طاوس - ڕووی تێکرد و وتی : (تۆ درۆ ئەکەیت لەبارەی الله ـەوە بە شتانێک کە نایزانیت) - معبد - وتی : درۆم بە دەمەوە ئەکرێت .

جا لەگەڵ طاوس دا ڕۆیشتم هەتا چووینە ژوورەوە بۆلای إبن عباس، طاوس پێی وت : (ئەی أبا العباس، ئەوانەی کە قسە لە قەدەردا ئەکەن ؟)، فەرمووی : (کوا دانەیەکیانم پیشان بدەن) .

وتم : چیی لێ ئەکەیت ؟

فەرمووی : (دەست ئەخەمە سەر سەری و ملی ئەشکێنم) .

**٣٣** - عمرو بن دینار وتی **طاوس** پێی وتین : (معبد الجهني سووک بکەن چونکە قسە لە قەدەردا ئەکات) .

**٣٤** - مالک بن أنس لە مامیەوە **أبي سهيل مالک بن أنس** بۆی گێڕاینەوە وتی : (لەگەڵ عمر بن عبدالعزیز دا ڕێمان ئەکرد جا ڕاوێژی پێ کردم لە قەدەریەکاندا، وتم : پێم وایە تۆبەیان پێ بکرێت، ئەگەر تۆبەیان نەکرد لە ملیان بدرێت .

وتی : (ئەوە بۆچوونی منە) .

مالک وتی : (ئەوە بۆچوونی منیشە) .

**٣٥** - **عمرو بن مهاجر** ئەڵێت : (بە عمر بن عبدالعزیز گەیشت کە غیلان قسە لە قەدەردا ئەکات، بەدوایدا نارد و چەند ڕۆژێک هێڵایەوە و پاشان بردیە ژوورەوە .

وتی : (غیلان ئەوە چییە لەسەر تۆ پێم گەیشتووە ؟) عمر بن مهاجر وتی : ئاماژەم بۆ کرد هیچ نەڵێت .

غيلان وتی : بەڵێ ئەی پێشەوای ئیمانداران، الله ئەفەرموویت : ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا (١) إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا (٢) إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا (٣) ﴾ (الإنسَان) .

عمر وتی : (کۆتایی سوورەتەکە بخوێنەرەوە ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا (٣٠) يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا (٣١) ﴾ (الإنسَان) .

پاشان عمر وتی : (چی ئەڵێیت غیلان ؟) .

وتی : من کوێر بووم تۆ وات کرد ببینم، من کەڕ بووم تۆ وات کرد ببیستم، من گومڕا بووم تۆ ڕێگەت پیشان دام .

عمر وتی : (اللهم ئەگەر غیلان ی بەندەت ڕاستگۆ نەبوو هەڵیبواسە) .

جا -غیلان- وازی لە قسەکردن لە قەدەردا هێنا، عمر بن عبدالعزیز بەرەڵای کرد لە دیمەشق، کاتێک عمر بن عبدالعزیز وەفاتی کرد و خەلافەت درا بە هشام دووبارە قسەی کردەوە لە قەدەر، هشام ناردی بەدوایدا و دەستی بڕی، مێش بە بەسەر دەستی غیلان ەوە بوو و پیاوێک بەلایدا تێپەڕی و وتی : ئەی غیلان ئەمە بە قەزا و قەدەرە .

وتی : درۆ ئەکەیت لعمر الله، ئەمە بە قەزا و قەدەر نییە، پاشان هشام ناردی بەدوایدا و هەڵواسرا .

٣٦ - **إبن عون** ئەڵێت : (بینیم غیلان هەڵواسرابوو بەسەر دەوازەی دیمەشقەوە ) .

٣٧ - **رجاء بن حيوة** بۆ هشام بن عبدالملک ی نووسی : (پێشەوای ئیمانداران پێم گەیشتووە کە شتێک لە دڵتدا دروست بووە لەبەر کوشتنی غیلان و صالح، سوێند بە الله کوشتنیان باشترە لە کوشتنی دوو هەزار ڕۆم و تورک ) .

: ئەو سەردەمە تورکەکان کافر بوون .

٣٨ - **الأصمعي** وتی : (هەر کەسێک بڵێت الله ڕزقی حەرام نادات ئەوە کافرە ) .

٣٩ - **حكيم بن عمير** ئەڵێت : (وترا بە عمر بن عبدالعزيز : ئەی پێشەوای ئیمانداران کۆمەڵە کەسانێک هەن لە قەدەردا بەو شێوەیە و بەو شێوەیە قسە ئەکەن .

عمر وتی : (بە نەرمی مامەڵەیان لەگەڵ بکەن ) .

پیاوێک وتی : ئەوە تۆ چی ئەڵێیت پێشەوای ئیمانداران! سوێند بە الله کردوویانە بە دین و خەڵکی بانگ ئەکەن بۆلای .

عمر لەوکاتەدا تووڕە بوو وتی : (سوێند بە الله ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، ئەوانە زمانیان لە پشتە ملیانەوە دەرئەکرێت، بۆ مێشوولەیەک فڕیوە لە نێوان ئاسمان و زەویدا ئیللا بە قەدەر نەبێت ! ) .

٤٠ - **الحسن البصري** وتی : (هەر کەسێک کافر بێت بە قەدەر کافر بووە بە ئیسلام) .

پاشان وتی : (بەڕاستی الله دروستکراوانی دروست کردووە بە قەدەر، وە ئەجەلی دابەشکردووە بە قەدەر، وە ڕزقی دابەشکردووە بە قەدەر، وە بەڵا و ناخۆشی و سەلامەت بوون بە قەدەرە) .

٤١ - **إبن عباس** رضي الله عنه ئەفەرموویێت : (هەموو شتێک بە قەدەرە، تەنانەت دانانی دەستت لەسەر ڕوومەتت بە قەدەرە) .

٤٢ - **مطرف بن عبدالله الشخير** ئەڵێت : (نەدراونەتە دەست قەدەر بەڵکو بەرەوڕووی ئەڕۆن) .

---

: ئەم ئەثەرە وتەی ئیمامێکی تابیعیە، هەموو مانای قەدەری تێدا کۆبووەتەوە، تۆ نابێت ئیش و کار نەکەیت و بڵێیت ئەگەر الله ڕزقی دابم هەر ڕزقەکەم دێتە بەردەرگا، بەڵکو ئەبێت هەوڵبدەیت و ئیش بکەیت، واتە نەدراویتەتە دەستی قەدەر و پاڵی لێ بدەیتەوە و کار نەکەیت، وە لە هەمان کاتیشدا هەر کارێک بکەیت هەر بەرەوڕووی قەدەر ئەڕۆیت، بۆ نمونە ئیش و کار نەکەیت و پارە پەیدا نەکەیت، یان ئیش و کار بکەیت و پارە پەیدا بکەیت هەردووکیان قەدەری الله عز وجل ن، ئەگەر بە خێرایی بە سەیارە بڕۆیت و بدەیت لە کەسێک و بیکوژیت ئەوە قەدەری الله تعالی یە، ئەگەر بە هێواشی بڕۆیت و لە کەس نەدەیت هەر قەدەری الله تعالی یە، ئەوەی لەسەر تۆیە کار بەو عەقڵە بکەیت کە الله پێیداویت، ئیش و کار بکە بۆ ئەوەی پارە پەیدا بکەیت، بە هیواشی سەیارە لێبخوڕە با لە کەس نەدەیت .

٤٣ - **الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ * إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ | (الصافات : ١٦٢ - ١٦٣) .

ئەڵێت : (شەیتانەکان کەس گومڕا ناکەن ئیللا ئەوانە نەبێت کە الله بۆ جەهەننەمی داناون) .

٤٤ - **الضحاك بن مزاحم** لە تەفسیری ئایەتی : | إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ * إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ | (الصافات : ١٦٢ - ١٦٣) .

ئەڵێت : (ناتوانن گومڕای بکەن ئیللا ئەوە نەبێت کە بۆ جەهەننەم دانراوە، ئەو کەسەی کە لە زانستی الله دا بۆی دانراوە ئەگات بە جەهەننەم) .

٤٥ - **سليمان التيمي** وتی : (پرسیار کرا لە عمر بن عبدالعزيز دەربارەی قەدەر .

وتی : (هیچ مێشوولەیەک لە نێوان ئاسمان و زەویدا نەفڕیوە ئیللا بە قەدەر نەبێت) .

پاشان بە پیاوەکەی وت : (ئەمجارە پرسیار دەربارەی قەدەر نەکەیت) .

٤٦ - **عبدالله بن عون** ئەڵێت : (لەو قەدەریانە بوغزێنراوتر نەبوون لەلای محمد بن سيرين) .

٤٧ - **الأوزاعي** ئەڵێت : (یەکەم کەس کە لە قەدەردا قسەی کرد لە ئەهلی عێراق بوو ناوی سوسن بوو، نەسرانی بوو، موسوڵمان بوو پاشان بوویەوە بە نەسرانی، جا معبد لێی وەرگرت، وە غیلان یش لە معبد ی وەرگرت) .

٤٨ - **عبدالله بن عون** ئەڵێت : (محمد بن سيرين بۆچوونی وابوو کە خێراترین کەس لە هەڵگەڕانەوەدا خاوەن هەوا و ئارەزووەکانن) .

٤٩ - **أبي قلابة** ئەیوت : (ئەهلی هەوا و ئارەزوو ئەهلی گومڕایین، وە وا ئەبینم سەرئەنجامیان ئیللا ئاگرە) .

٥٠ - **أبي قلابة** ئەیوت : (لەگەڵ خاوەن هەوا و ئارەزووەکاندا دامەنیشن و موناقەشەیان لەگەڵ مەکەن، چونکە من دڵنیا نیم لەوەی هەڵتانبکێشن لە گومڕاییدا، یان شتێک گومڕاییتان تووش بکەن لەوەی کە خۆیان تووشی بوون) .

٥١ - **أبي قلابة** ئەیوت : (هیچ کەسێک نەبووە بیدعەیەک دابهێنێت ئیللا شمشێری بە حەڵاڵ زانیوە) .

---

: (شمشێری بە حەڵاڵ زانیوە) واتە شمشێری بە ڕەوا زانیوە لە دژی ئەو کەسانەی کە دژی بیدعەکەی ئەوەستنەوە یان قبووڵی ناکەن .

٥٢ - **یحیی بن أبي کثیر** ئەڵێت : (ئەگەر خاوەن بیدعەیەکت لە ڕێگادا بینی ڕێگایەکی تر بگرەرەبەر) .

٥٣ - دوو پیاو لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو چوونە لای **محمد بن سیرین** و وتیان : ئەی أبا بکر فەرموودەیەکت بۆ ئەگێڕینەوە .

وتی : نەخێر .

وتیان : ئایەتێک لە کتێبی الله بۆ ئەخوێنینەوە .

وتی : نەخێر، هەڵئەستن لەلام یان من هەڵئەستم .

دوو پیاوەکە هەستان و چوونە دەرەوە .

٥٤ - **سلام بن أبي مطيع** ئەڵێت : پیاوێک لە ئەهلی هەوا و ئارەزوو پرسیاری لە أيوب السختياني کرد وتی : ئەی أبا بکر پرسیارت لێ ئەکەم دەربارەی وشەیەک .

أيوب ڕووی وەرگێڕا و وتی : نەخێر تەنانەت نیو وشەش، نەخێر تەنانەت نیو وشەش .

٥٥ - **سلام بن أبي مطيع** ئەڵێت : أيوب السختياني هەموو خاوەنانی بیدعەی بە خەواریج ناوئەبرد و ئەیوت : (خەواریج لە ناودا جیاوازن وە لەسەر شمشێر کۆبوونەتەوە ) .

٥٦ - **إبن عون** وتی : (محمد بن سيرين پێی وابوو ئەم ئایەتە دەربارەی ئەهلی هەوا و ئارەزوو دابەزیووە : ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الأنعام : ٦٨) .

٥٧ - **مهدي بن ميمون** وتی : (گوێم لێبوو لە محمد بن سيرين پیاوێک موناقەشەی لەگەڵ کرد لە بابەتێکدا .

محمد پێی وت : (من ئەزانم تۆ چیت ئەوێت، وە لە تۆ چاکتر لە موناقەشەکردن ئەزانم، بەڵام موناقەشەت لەگەڵ ناکەم) .

٥٨ - پیاوێک هات بۆلای **الحسن البصري** وتی : ئەی باوکی سعيد، وەرە با مشتومڕت لەگەڵدا بکەم لە دیندا .

الحسن وتی : من دینی خۆمم دۆزیوەتەوە، ئەگەر تۆ دینی خۆتت لێ ون بووە بەدوایدا بگەڕێ .

٥٩ - **أبا إسحاق الهمداني** ئەڵێت : (هەر کەسێک خاوەن بیدعەیەک بە گەورە ڕابگرێت ئەوە پشتیوانی ڕووخاندنی ئیسلامی کردووە) .

٦٠ - **محمد بن واسع** وتی : (صفوان بن محرز المازني م بینی لە پاڵیدا کۆمەڵە کەسێک دەمەقاڵێیان بوو، هەستا و جلەکانی تەکاند و وتی : ئێوە گەڕن) .

٦١ - **مسلم بن يسار** وتی : (ئاگاداری دەمەقاڵێ بن، چونکە ئەوە ساتی جاهیل بوونی زانایە، وە لەو ساتەدا شەیتان تامەزرۆی هەڵەکردنیەتی) .

٦٢ - **أبي العالية** وتی : (لەدوای دە ساڵ لە وەفاتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ قورئانم خوێندەوە، وە الله دوو نیعمەتی پێداوم نازانم کامەیان چاکترە، ئەوەی کە هیدایەتی داوم بۆ ئیسلام، یان ئەوەی نەیکردووم بە حەروری) .

---

: حەروریەکان جۆرێکی خەواریجن .

٦٣ - عثمان بن الأسود ئەڵێت وتم بە **مجاهد** : (ئەی باوكی حجاج، هەستم كردووە بەوەی وهب ی مەولای سلامة قەدەری بێت) پاشان منی بینی لەگەڵی، دوای ئەوە ڕۆشتمەوە بۆلای مجاهد وەک بڵێیت ڕووی گرژ بوو بەرامبەرم .

وتی : (تۆ نەتوت وهب قەدەریە ! پاشان لەگەڵی بینیمیت ! ) .

٦٤ - **محمد بن كعب القرظي** ئەڵێت : (كاتێک خەڵكی قسەیان كرد لە قەدەردا، تەماشام كرد بینیم ئەم ئایەتە لەسەر ئەوان دابەزیوە : ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ * يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ * إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾ (سُورَةُ القَمَر) .

٦٥ - **علي بن عبدالله** ئەڵێت پرسیارم كرد لە يحيى بن سعيد القطان و عبدالرحمن بن المهدي لەبارەی ئەم فەرموودەیە : (هەموو شتێک بە قەدەرە) مانای چییە كە بە قەدەرە ؟

وتیان : (زانی، وە نووسی) .

٦٦ - **إبن عباس** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (سێ مەجلیس هەیە تێیدا شەیتان زاڵ مەكە بەسەر خۆتدا، : مەجلیسی قورئان، وە ئافرەتێک كە حەلاڵت نییە چونكە شەیتان سێیەمتانە، وە دامەنیشە لەگەڵ ئەهلی هەوا و ئارەزوو، چونكە دانیشتن لەگەڵیان دڵەكان نەخۆش ئەكات) .

٦٧ - **أبا إدريس** وتی : (الله تعالى قەڵەمی دروست كرد، پاشان هەموو ئەوەی نووسی كە هەتا قیامەت ڕوو ئەدەن) .

٦٨ - **إبن عباس** رضي الله عنه لە تەفسیری ئایەتی | كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ * فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۗ | (الأعراف) .

ئەفەرمووێت : هەر بەم شێوەیە دروستی کردوون و کردوونی بە ئیماندار و کافر و خۆشبەخت و چارەڕەش، هەر بەم شێوەیەش ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی قیامەت بە هیدایەتدراویی و گومڕایی .

٦٩ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (کاتێک الله ئادەمی دروست کرد، بە دەستی دای لە لای ڕاستی جەستەی ئادەم، دروسکراوانێک هاتنە دەرەوە وەکو تۆسقاڵ - گەردیلە - بوون، فەرمووی : ئەی ئادەم ئەمە نەوەکانی تۆن لە ئەهلی بەهەشت، پاشان بە دەستی خۆ دای لە لای چەپی جەستەی ئادەم، دروسکراوانێک هاتنەدەرەوە وەکو خەڵوز، پاشان فەرمووی : ئەمە نەوەکانی تۆن لە ئەهلی ئاگر) .

٧٠ - **الزهري** لە سعيد بن المسيب ەوە ئەڵێت : (کاتێک چەقۆ لە عمر بن الخطاب درا کعب وتی : ئەگەر عمر داوای لە الله بکردایە ئەوە الله ئەجەلەکەی بۆ دوائەخست .

خەڵکی وتیان : سبحان الله، مەگەر الله نافەرمووێت : | فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ | (الأَعۡرَاف : ٣٤) ؟

کعب وتی، وە ئەفەرمووێت : | وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ | (فَاطِر : ١١) .

الزهري ئەڵێت : (وایئەبینین کاتێک ئەجەلی هات ئەوە نە یەک سات پێش ئەکەوێت نە یەک سات دوائەکەوێت، وە ئەوەی ئەجەلی نەهاتووە ئەوە الله بۆی دوا ئەخات و بۆی پێش ئەخات ئەوەندەی کە بیەوێت، وە هیچ کەسێک نییە ئیللا تەمەنی نووسراوە ) .

٧١ - **الحسن البصري** لە تەفسیری ئایەتی : | هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ | (النَّجْم : **٣٢**) .

ئەڵێت : (الله عز وجل زانی کە هەموو نەفسێک چ کار و کردەوەیەک ئەنجام ئەدەن، وە بەرەو چی ئەڕۆن ) .

٧٢ - **أبو إدريس الخولاني** ئەڵێت : (ئەگەر گوێم لێبێت کە لە سووچێکی مزگەوتدا ئاگرێک کەوتووەتەوە پێم خۆشترە لەوەی گوێم لە بیدعەیەک بێت و هیچ کەسێک هەوڵی گۆڕینی نەدات . . . ) .

والحمد لله رب العالمين

